

# ڕێـگای لەبەرکردنـی زیرەکـان

## ڕێگایەکی ناوازە
## بۆ لەبەرکڕدنی دەقە زانستیـەکان

دانراوی : شیخ احمد بن مصطفى الشافعي



باوکی عبداللە :: Bawky Abdullah





**بەناوبانگ بووە لای کۆمەڵێک لە زانایان، لەوانە الحافظ ابن حجر العسقلاني ڕێگای لەبەرکردنی زیرەکەکان و ڕوونکردنەوەی :**

1

ئەو بڕەی دیاریت کردووە کە لەبەری بکەیت: دەجار چاوی پێدا بخشێنەوە بە ووردی و تێگەیشتنی تەواو وە ئەگەر لە دەجار زیاترت کرد باشترە .

دوو مەرج ئەبێ ئاگاداری بیت لەم قۆناغەدا :



نابێ چاوەکانت لەسەر کتێبەکە بەرزبکەیتەوە:
تاوەکو وێنەی لەبەرکردنەکەت دەچەسپێ لە مێشکت .

پاش نوێژی بەیانی ڕاستەوخۆ دەست پێ بکەیت :
ئەو فێرخوازی زانستەی لەدوای نوێژی بەیانی ئەخەوێت ... دڵسۆز نیە

2

پاشان وردە وردە چاوت بەرزئەکەیتەوە هەوڵ ئەدەی بە لەبەر بیڵێیتەوە ئەوەی کە خوێندتەوە،
تاوەکو دەتوانی دووبارەی بکەیتەوە سێ جار بۆ ئەوەی سەیری بکەیت .



3

کتێبەکە دابخە ـ لێرەوە سەرەتای لەبەرکردنە ـ

لەبەرکردنەکەت حەفتا جار دووبارە بکەرەوە، ئەگەر
نەتتوانی ... ئەوا سـی جار لەوە کەمتر نەبێ .

4

پاشان پشوو بدە تاوەکو عەسر دوای ئەوە بگەڕێوە سەر لەبەرکراوەکەت،
دەیبینی لاواز بووە و پشێوی تێکەوتووە،
بـەبێ ئەوەی سەیری بکەی.. سـی جار دووبارەی بکەوە،
پاشان دوای عیشاش بە هەمان شێوە .

5

پاشان دوای نوێژی بەیانی ئەوەی پێشوو سی جار دووبارە بکەوە، پاشان
نوێیەکەت دە جار دەخوێنیتەوە بە وردی، پاشان حەفتا جار، پاشان لەدوای
نوێژی عەسر ئەوەی پێشوو سی جار دووبارە بکەرەوە، پاشان نوێیەکەت سی
جار دەخوێنیتەوە، بەم شێوە تاوەکو دوای نوێژی عیشا .

6

پاشان دوای نوێژی بەیانی لەبەرکراوی یەکەمت سی جار دەخوێنیتەوە،
لەو کاتەدا لەبەرکردنەکەت جێگیر دەبێت، وازی لێ بێنە تاوەکو دووبارە
کردنەوەیەکی نزیکیش نەبێ إن شاء اللّٰه ، پاشان لەبەرکراوی دووەمت سی
جار، پاشان نوێیەکەت دە جار بەوردی، وە بەم شێوەیە .